# چۆن شەش هاوەڵەکەی پێغەمبەر شەهید دەکرێن.

## تەوبەکردنی مالیکی کوڕی دینار

مامۆستا شێرزاد

www.iqra.ahlamontada.com
منتدى اقرأ الثقافي



بۆ چاپکردن و بڵاوکردنەوە
066 22 33 868
هەولێر

پەیڤێک

لەوتارەکانی مامۆستا شێرزاد

# چۆن شەش هاوەڵەکەی پێغەمبەر ﷺ شەهید دەکرێن؟
# تەوبە کردنی مالیکی کوڕی دینار.


لە ووتارەکانی

مامۆستا شێرزاد

نووسینەوەی

ئیلاف أحمد غزالی

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : پەیڤێك لەوتارەکانی مامۆستا شێرزاد

نووسینەوەی نیلاف أحمد غزالی

پێداچوونەوەی مامۆستا شێرزاد

سەرپەرشتی چاپ نهرۆ محمود

چـــاپ : یەکەم/هەولێر/٢٠٠٨

تیراژ : ( ١٠٠٠ ) دانە

بلاوکراوەی کتێبخانەی

حاجی قادری کۆیی

بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بلاوکردنەوە

هەولێر کوردستان عێراق

مافی چاپ پارێزراوە

ژمارەی سپاردن : ٢١٤٣

رێگام داوە بە کتابخانەی حاجی قادری کۆیی

ئەم لیستێتە بکۆکردنەوە و نووسینەوەی

ووتارەکانمەوە بە چاپی بگەیەنێ

بە شێوەیەکی جوان دەستخۆشیان

لێ ئەکەم خوا پاداشتیان بداتەوە

برایان

ملا ئیرشاد عبدالوهاب

٢٧ - رجب - ١٤٢٩

بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمدلله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات اعمالنا من يهد الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له. وأشهد أن لا اله الا الله وحده لا شريك له وأشهد ان سيدنا محمدا عبده ورسوله. اللهم صل وسلم وبارك على سيدنا وحبيبنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم.

أما بعد...

**موسڵمانانی خۆشەویست، ئەی گەنجانی بەڕێز، ڕەحمەتو میهرەبانی خوای گەورە بڕژێ بەسەر دڵ و دەروونی هەموومان... یارەبی خودایە لە هەموو لایەکمان خۆش بی. یارەبی خودایە لە گوناهەکانمان خۆش بی.. خودایە تۆ خودایەکی "رب العالمين"ی ئێمەش**

عەبدێکی زەلیلین خودایە لێمانْ خۆش بە. خوایە گوناهەکانی ئێمە زەرەر بە تۆ ناگەیەنێ. خوایە عەفوومان بکەی. خودایە ئەو دڵانە بە نووری خۆت رووناك بکەیتەوە. خودایە دەفتەری کردارمان لە گوناه سپی بکەیتەوە.. خودایە ئەو کەسانەی ئایینت بەسەر دێخن بەسەریان بێخە. خودایە ئەو کەسانەی شەڕ بە ئایینت دەفرۆشن خودایە لە ناویان بەری. خودایە ئەو کەسانەی نیهانەی زانایان دەکەن، خودایە نیهانەیان بکەی. خودایە بیانکەیتە پەندی زەمانە. خودایە شیفای نەخۆشەکانمان بدەی. خودایە دەردی دەردەدارەکانمان تیمار بکەی. خودایە قەرزی قەرزارەکانمان بدەیتەوە, خودایە ئەوانەی لێیان قەوماوە بە هانایان بچی. ئەوانەی گیراون ئازادیان بکەی. خودایە رەحم بە ئومەتی محمد ﷺ بکەی. خودایە ئەو کەسەی ئەیەوێ تانە لە محمد المصطفى بدا. خودایە لە ناوی بەریو سوكو ریسوای بکەی...

آمين.. آمين.. والحمدلله رب العالمين..

# ووتاری یەکەم

## چۆن ئەمش هاوەڵەکەی پێغەمبەر ﷺ شەهید دەکرێن؟

برایانی بەرێزم. خوشکانی موسلمان.. خەبەرێك هاتوە ئەڵێن پێغەمبەر ﷺ. زۆر غەمگینە. زۆر عاجزو خەفەتبارە.. جا ئەو کەسانەی عەشقی محمد المصطفی ﷺ لە دڵیان دایە. ئەو کەسانەی حەز دەکەن ببینن‌و لە بینینی بێ بەش نەبن. فەرموون لەگەڵ من بێن. با بچین سەردانی ئەم خۆشەویستەمان بکەین کە محمد المصطفی ﷺ با بچین سەردانی بکەین‌و هەندێ قسەی لەگەڵ بکەین‌و لێی بپرسین, بڵێین ئەی پێغەمبەری خوا. ئێمە خەبەرێکمان بیستووە کە تۆ غەمگین‌و دڵ تەنگو غەمباری. پێمان خۆشە بزانین. تاکو ئێمەش بەشداری غەمت بین، تاکو ئێمەش بتوانین لەگەڵ تۆدا تۆزێك ئەو غەمو پەژارەیەی هەیە سوك بکەین، کاتێك ئەچین, ئەگەینە شاری مەدینە شاری پێغەمبەری خودا ﷺ. دەبینین خەڵك پێناکەنێ. ئەبەدەن زەردەخەنەیان بە دەم دانایێ. هەر هەموویان چاو بە فرمێسکن.

هەر هەموویان غەمبارن. دەبێ هەموویان وابن. ئێمە وامانزانی بەس پێغەمبەری خوا ﷺ وایە. خۆ شاری مەدینە هەمووی غەمبارن کەمێکی تر بڕۆ. بڕۆ ناو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، دەبینی ئیمامی ئەبوبەکر وا ئەگریێ، ئەوە عومەرە وا دانیشتووە، ئەوە بیلالە وا هاوار دەکا. پێغەمبەری خواش ﷺ لە لای میحرابەکەی خۆی دانیشتیەو غەم دایگرتیە. فەرموو با بچینە پێشی بچینە خزمەتیو لێی بپرسین. کە دەچینە پێشیو سەلامی لێدەکەینو دەڵێین. السلام علیکم یا رسول الله. کاتێك کە لە خزمەتی دادەنیشینو سەلاممان لێی کرد. لێی ئەپرسین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟! بە دایكو باوكو کەسو کارەوە بە قوربانت بین. پێمان بڵێ بۆ عاجزی بۆ غەمگینی. تاکو ئێمەش بتوانین لەم غەمەدا یارمەتیت بدەین بەڵام وەڵامان ناداتەوە، سەحابەیەك لەو تەنیشتە. دەڵێ باوکە لێی گەڕێن. ئێوە نازانن چ قەوماوە شەش سەحابەی بەڕێز شەهید کراوە. شەش سەحابەی بەدر ئەوانەی بەشداریان لە شەڕی بەدردا کردووە. بە غەدر

کوژراون جا ئێمەش عاجز دەبین غەمگین دەبین, بەڵام چیمان پێ ناکرێ بیکەین, ناچارین لە سەحابەکە دەپرسین, دەڵێین باشە بە قوربانت ئەبین. پێمان بڵێ لەبەر چی ئەوانە شەهید کران، لەبەر چی ئەوانە بە غەدر کوژراون. لەبەر چی روحی پاکیان تەسلیمی رب العالمین کرد. دە گوێ رابگرن لەگەڵ من، هەمووومان لەم مەجلیسە موبارەکەدا کە پێغەمبەری خواﷺ دانیشتووە. دادەنیشین بزانین دەنگوباس چییە لە مەدینە. سەحابەکە دەفەرمووێ. پێغەمبەری خواﷺ دانیشتبوو غەمگین و عاجز لەبەر ئەوەی لە شەڕی ئوحد شکستی کەوتبووە سەر موسڵمانەکان. لەبەر ئەوەی فەرمانەکەی پێغەمبەریانﷺ شکاند. بۆیە خوای گەورە ئەم دەرس‌و عیبرەتەی پێدان. بۆیە هەر کاتێ یەک فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بشکێ. ئەوا موسڵمانان بە شکاوی‌و زەلیلی خۆ ئەبیننەوە. گوتی لەو کاتەدا دانیشتبووین غەم و خەفەتی ئوحدمان باس دەکرد، کابرایەك هات لە قەومی (هذیل) فەرمووی یا رسول الله لە ناو میللەتی ئێمەدا موسڵمان پەیدا

بووینە، پێم خۆشە هەندێك سەحابەی نازداری خۆت رەوانە بکەی لەگەڵم, لەوێ فێرە قورئانیان بکەن، فێرە أحکامی ئیسلامیان بکەن، فێرە شەریعەتی خوایان بکەن. پێغەمبەریش ﷺ زۆر کەیفی خۆش بوو بەم قسەیەو بەم خەبەرە زۆر دلشاد بوو کە موسڵمانان پەیدا بووینە، ئەمە بەشارەتە ئەمە موژدەیە، دەی وەرن دەی شەش کەس کۆ ببنەوە دەی سەحابە بەدریەکان، وەرن شەش کەستان بڕۆن لەگەڵ ئەو کابرایە بەرێکەون، بڕۆن لەو شوێنەدا کە ئەو کابرایە باسی ئەکا، بڕۆن ئایینی خوا بڵاو بکەنەوە. سەحابەکانیش ئەمانە بوون:

١- مورثدی کوڕی أبی مورثد.

٢- خالیدی کوڕی بەکیر.

٣- عاصمی کوڕی ثابت.

٤- خوبەیبی کوڕی عدی.

٥- زەیدی کوڕی دثنە.

٦- عبدالله کوڕی طاریق.

ئەم سەحابانە کە هەر شەشیان لە خزمەت پێغەمبەری خودا ﷺ لە جەنگی بەدر بەشداریان کردیە. هەموو وسامی شەرفیان لە لایەن ((رب العالمین)) لە ملی کراوە. ئەوە ئیسلامەتیە کە خوای گەورە پێی فەرموون ﴿اعملوا ما شئتم﴾ چی دەکەن بکەن خوا لێتان رازی بووە. ئەوە گەورەترین موژدەیە ئەو ئایەتە کە ئەوانە وەریان گرتیە. ئەوانە لەگەڵ کابرا بەرێدەکەون. ئەچنە ئەو شوێنەی کەوا موسڵمانانی لێ پەیدا بووە. کاتێك شوێنێك کە پێی دەڵێن ((ماء رجیع)) کانیەك کە ئاوی تێدایە کە پێی دەڵێن ئاوی ((رجیع)) لەوێ قەومی هذیلی تێدا بوو پێیان دەگووت ((بن لحیان))، ئەوانە سەد پاڵەوانیان بە دوای ئەو شەش سەحابە کەوتن، تا لەسەر ئاوەکە گەیشتن پێیان، دەوریان لێدان گوتیان دەبێ ئێوە ئەسیر بن. پیاوی چاك بن ئێمە هاتووین دین فێری ئەو خەڵکە بکەین، ئێمە نەهاتووین چەك لەگەڵ خۆمان بهێنین، شەڕتان لەگەڵدا بکەین. هاتووین نوری خودا بڵاو بکەینەوە. هاتووینە رەحمەتو بەزەیی خودا بڵاو بکەینەوە. لێمان بگەڕێن

با برۆین, گووتیان نەخێر رێ نییە دەبێ بە ئەسیری خۆتان تەسمیلی ئێمە بکەن. تاکو ئێمە بتاندەینەوە دەستی مەکیەکان و بتانفرۆشین, بەلام ئەو سەحابانە مادام بەدریان دیتبێ. مادام لە خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺ شەڕیان کردبێ. زۆر زەحمەتە خۆ بدەنە دەست, ئەوەبوو سێیانیان عاسێبوون "گووتیان ئەبەدەن ئێمە خۆمان نادەینە دەست, لەوانە عاصمی کوڕی ثابت، مورثەدی کوڕی ئەبی مورثەد, خالیدی کوڕی بەکیر، سێیەکەی دی بێ دەنگ بوون. عاصم چۆن خۆی تەسلیم دەکات لەبەر ئەوەی پەیمانی دابووە خوا, دەیفەرموو خوایە وەعدو پەیمان دەدەمە تۆ, وەبکەی نە دەستم بە موشریکێك بکەوێ نە موشریکێك دەستی پێم بکەوێ. عاصم چۆن خۆی دەداتە دەست لەو کاتەی کە پێغەمبەری خواﷺ لێی ئەپرسێ ئەی عاصم چۆن شەڕ دەکەیت, فەرمووی یا رسول الله ئەگەر ئەوان دوو سەد باڵ لە ئێمە دوور بن ئەوە تیریان تێدەگرم. ئەگەر نزیکتر ببنەوە ئەوا رمیان تێدەگرم. بەلام ئەگەر رمەکانیشم پێ نەما ئەوا دەست

دەكەمە شيرو ئەچمە مەيدان فەرمووى "هكذا نزل الحرب" بەم شێوە شەڕ دابەزيوە, ئەوەى شەڕ دەكا با لەسەر فكرەى عاصم شەڕ بكات. بەڵێ چۆن عاصم خۆ ئەداتە دەست, لەو كاتەى دوو موجريمى زۆر گەورەى قورەيشى كوشتبوو لەوانە مسافعو جەلاسى كوڕى طلعە.. هەردووكيان كوڕى طلعە بوون كە بە دەستى عاصمى كوژرا بوون, لەو كاتەدا دايكى ئەو دوو كوڕە كە ناوى سولافەى كچى سەعد بوو كە هاتە سەر مەيتى كوڕەكانى, يەكيان هێشتا مابوو روحى نەدابوو، لەو كاتەدا دايكەكە سەرى هاويشتە سەر ڕانى گوتى رۆڵە گيان كێ لێيدان؟ گوتى نازانم, بەڵام كەسێك كە تيرى تێدەگرتمو شيرى لێدام ئەى گوت ها بگرە لە كوڕى ئەبى ئەفلەحى.. گوتى من دەيناسم ئەمە كێيە. ئەمە (عاصمى كورى ثابت)ـە گوتى نەزر بێ لەسەرم, سەرى ئەو كەسە ببڕم, لە كاسەى سەرى ئارەقى تێدا بخۆمەوە. عاصم چۆن خۆ ئەداتە دەست كە بزانێت دوژمنانى خوا ئاوا لێى كۆڵدارنو لە كاسەى سەرى دەگەڕێن، هەتاكو ئارەقى تێدا بخۆنەوە. بەڵێ

ئەدی میرئەدی کوڕی میرئەد ئەو چۆن خۆ بداتە دەست کاتێك لەگەڵ ئیمامی حەمزە لە شەڕی بەدرو ئوحددا گێرەو ویژەیان بە کافرەکان کردبوو, زۆریان لێ کوشتبوون. وە هەروەها لەگەڵ خالیدی کوڕی بەکیر ئەو خالیدەی لەگەڵ عبداللەی کوڕی جعش یەکەمین سریە بوون لە سریەکان کە پێغەمبەر ﷺ کافرەکانی قورەیشی پێ تۆقاندبوون, ئەوانە ئەبەدەن نەیان دەتوانی خۆیان بدەنە دەست، بۆیە دەستیان بە شەڕ کرد ئەوە بوو, عاصم حەوتی لەوان کوشت، پاشان شەهید بوو, کە شەهید بوو کەوتە سەر زەوی کۆتایی قسەی ئەوە بوو گوتی خودای میهرەبان ئەی خودای تاكو تەنها من ئایینی تۆم بەم بەیانیە پاراست تۆش ئێوارێ گۆشتو لاشەی من بپارێزە لە دەستی ئەوانە. وەعدی دابووە خودا کە هیچ موشریکێك دەستی نەکاتە لاشەی. بەڵێ خودای میهرەبان ئەم لاشەیەی پاراست. پاش ئەوەی کە کافرەکان سێ کەسەکەی تریان بە ئەسیرگرت، چوون سەری عاصم لێ بکەنەوە. بۆ ئەوەی دیارییەکی لەو ئافرەتە وەربگرن,

کاتێ کە چوون خوای گەورە زەردەواڵەی لە سەر لاشەکەی دانابوو. زەردەواڵەکەی ئەوەندە زۆر بوو، کافرەکان نەیانتوانی بچن سەری لێ بکەنەوە. ئەوە بوو گووتیان با بەجێی بهێلین، ئێوارێ دێین دەیهێنینەوە. ئێوارێ کە هاتن کەس نازانی مەیتەکە کێوەچوو. خوای گەورە حەشاری داوە، بەڵێ ئەو سێیەن کە شەهید بوون. هەرسێکیان خوێنی پاکیان بۆ (رب العالمین) رێشت، بۆ ئەوەی بێ غیرەتی قبوڵ نەکەن. سێ کەسەکەی تر، سێ سەحابە بەرزو بەرێزەکەی تر، ئەوان ناچار بوون. لەبەر ئەوەی ئەوان زۆر بوون سەد کەس بوون ئەگەر چی نەوەدو سێ کەسیان مابوو. حەوتیشیان لێ کوژرا بوو. دەرەقەتیان نەدەهاتن ناچار بەرێ کەوتن لەگەڵیان رۆیشتن لە رێگادا "عبداللەی کوری طارق" فکری کردەوە گوتی واللەی ئەوە نامەردیە ئەوەی من دەیکەم بێ غیرەتیەو زەلیلی قبوڵ ناکەم خۆی پچریەوە دەستی دایە شیرو لە بۆیان چوو، بەڵام ئەو موجریمانە بە هەر هەموویان بەرد بارانیان کردو هەر بە بەردان لەوێ ناشتیان و شەهیدیان کرد،

دووانیان مانەوە لەو سەحابانە زەیدی کوڕی دثنەو خوبەیبی کوڕی عەدی. ئەم دوو موسڵمانە پاکە. ئەم دوو سەحابە بەڕێزەیان برد بۆ شاری مەککە لەوێ فرۆشتیان و گۆڕیانەوە بە چەند ئەسیرێکی قەومی خۆیان. ئەو دوو سەحابە بەرزو بەڕێزە لە شاری مەککە مانەوە. دوو کەسی موجریم ئەوانەی کڕی هەردووکیان باوکیان کوژرابوو. خوبەیب عوقبەی کوڕی حاریث کە باوکی کوژرابوو. ئەو خوبەیبی کڕی, لە جیاتی باوکی خۆی تا بیکوژێ. هەروەها زەیدیش ئەویش صەفوانی کوڕی ئومەیەی کڕیەوە کە ئومەیەی کوڕی خەلەف بوو باوکی کوژرابوو کە زەید لە جیاتی بکوژتەوە, بەڵی ئەو دوو سەحابەیان ئەسیر کرد لە ماڵێك لە ماڵەکانی مەککەیان دانان بە جودا، جا ئەو ئافرەتەی کە خوبەیبی لە لا بوو لە ماڵی وی ئەسیر کرابوو، باسی خوبەیب دەکاو دەڵێ. قەت پیاوی وام نەدیتوە. بە رۆژ هەر نوێژو زیکرو تەهلیلەو قورئان خوێندن. بە شەویش شەو نوێژو پاڕانەوەو نزا لە ((رب العالمين))، گوتی زۆرم پێ سەیر بوو، هەتا دەڵێ

ڕۆژێکیان ترێیەکم دیت، ئەم جۆرە ترێیە هەر ئەسڵەن لە مەککەش وجودی نییە. پێم سەیر بوو کە شاری مەککە ترێی وای نییە کێ ئەو ترێیەی بۆ ئەو کابرایە هێناوە. کە لە لای ئێمە ئەسیرەو لە ژوورێکمان داناوە، لەو کاتەدا نزیکی ئەوە بوو لە سێدارەی بدەن. خوبەیب داوای موسێکی کرد لە ئافرەتەکە پێم خۆشە خۆم پاکو تەمیز بکەم کاتێك بە خزمەت خوای گەورە دەگەم. لەو کاتە ئافرەتەکە منداڵێکی لە لا بوو موسەکەی دا دەستیو پێی گوت بۆی ببە. کە منداڵەکە چووە لای خوبەیب, ئافرەتەکە دەڵێ پەشیمان بوومەوە. گوتم باشە چۆن ئەو منداڵەم نارد. کێ دەڵێ ئێستا تۆڵەی خۆی لەو منداڵەی ناکاتەوە، کێ دەڵێ منداڵەکە ناکوژێ، گوتی بە پەلە چوومە ژووری دیتم وا بە منداڵەکە پێدەکەنیو منداڵەکەش لەگەڵ ئەو پێدەکەنێت، لەسەر کۆشی خۆشی داناوە, گوتی کاتێك چاوی بە من کەوت, ئافرەتەکە دەڵێ خوبەیب گوتی وات دەزانی من غەدر لەم منداڵە ئەکەم نا.. دینەکەم لێناگەڕێ ئەم جۆرە کارانە بکەم. ئەمە

منداڵەو هیچی لەسەر نییەو چۆن من دەیکوژم. بەڵێ کاتێك رۆژی لە سێدارەدانی هات هەردووکیان لە ماڵی هێنایە دەرێو لە بەرامبەر یەکیان دانان لەو کاتی خوبەیبو زەید دەستیان لە ملی یەکتری کردو یەکتریان ماچ کردو ئامۆژگاری یەکتریان کرد کە سەبرو ئارامیان هەبێ تا ئەو کاتەی روحی پاکیان بە خزمەت رب العالمین دەگاتەوە. بەڵێ لەو کاتەدا زەیدیان هێنایە دەرێو لە جێیەکی کە پێی دەڵێن (تنعیم) لەوێ لە دار خورمایەکیان بەستا و هەڵیان واسی لە بەرامبەریشی مەجموعەك تیرهاوێژ راوەستا بوون, جار بە جار تیرەکیان لێ ئەدا واتە لە عەزابێکی زۆر ناخۆشدا دەژیا, لەو کاتەدا ئەبو سوفیان هاتە لایو گوتی زەید تۆ ئەو هەموو ئەزیەتو ئازارە ئەدرێی, پێم بلێ حەز دەکەی ئێستا محمد لە شوێنی تۆ بێو تۆش لە ناو ماڵو منداڵی خۆت بنووستبای؟ گوتی نەخێر وە ﷲی حەز ناکەم ﷺ لە شوێنی خۆی ئێستا کە هیچ بەڵای لێ نییە, تەنیا یەك دڕکیش لە پێی رابچێ, ئەگەر چی من لەم ئەزیەتو ئازارەش دام. ئینجا ئەبو

سوفیان گوتی لە ژیانم نەمدیووە کەسێك کە کەسێکی خۆش ویستبێ وەکو بە دواکەوتوانی ﷺ کە ﷺیان خۆش ویستبێ، کەسم نەدیتووە لە مێژوو کەسم نەبیستووە ئاوا وەکو سەحابەکانی پێغەمبەر پێغەمبەریانﷺ خۆش بووێت، بەڵێ لەو کاتەدا، دایانە بەر تیران.. زەیدی پاكو خواناس روحی پاکی تەسلیمی رب العالمین کرد. ئینجا هاتنە لای خوبەیب لە دەوری سووڕانەوەو خوبەیب گوتی یەك تکام هەیە پێش ئەوەی بمکوژن. لێم بگەڕێن دوو رکعات نوێژ بکەم. گوتیان باشە, دوو رکعات نوێژی کرد, پاشان گوتی خەڵکینە وە اللهی نەوەکو بڵێن لە ترسی مردن نوێژەکەی دوورو درێژ کردەوە, ئەگەرنا درێژم ئەکرد. بەڵێ یەکەمین کەس پێش ئەوەی شەهید بکرێ دوو رکعات نوێژی کردبی. ئەوە خوبەیب بووە بەڵێ کاتێ کە خوبەیبیان هێنا, پاشان چل کەسیان هێنا کە تیرهاوێژ بوون. هەر هەموویان تیر لە خوبەیب بگرن, دایانە بەر تیرانو ئەویش ئەو دوعایەی دەکردو دەیفەرموو "اللهم أحصیهم عددا وأقتلهم بددا

ولا تغادر منهم أحدا" خوایە یەك یەكیان بژمێری, خوایە لە دوای یەكیشیان بكوژی‌و كەسیشیان لێ قوتار نەكەی, كە ئەو دوعایەی كرد معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان لە ترسان دانیشت, یەك دوو كافری دیكە لەوێ بوون لە ترسی ئەو دوعایە رایان كرد. زانیان ئەم دوعایە موستەجابە، بەڵێ لەو كاتەداكۆتایی قسەی خوبەیبی ئەوە بوو, گوتی یا إلهي یا رب العالمین خۆ من بەس دەم‌و چاوی كافرەكانم لێ دیارە، كەس لە موسڵمانانم لێ دیار نییە بەس كافر نەبێ, خودایە. خوایە سەلامی من بە ﷺ بگەیەنە. خەبەری بدێ كە ئێمەیان بە زوڵم كوشتووە لەو كاتەدا حەزرەتی جبرائیل دابەزی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەدینە بوو. گوتی ئەی ﷺ خوبەیب سەلامت لێ دەكا ئێستا خوبەیب و هاوەڵەكانی شەهیدكران. بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا سەلامی ئیمەشت لێ بێ ئەگەر چی ئێمە گوناهبارو بێ غیرەتین بەرامبەر بە تۆ. لەبەر ئەوەی وا ئیهانەی تۆ دەكرێ وا شەرەفی تۆ قسەی لەسەر دەكرێ, وا جوێن بە تۆ دەگوترێ و بە قورئانەكەت ئێمە

غیرەتمان نییە، خۆزگە غیرەتی خوبەیبمان هەبووایە، خۆزگە غیرەتی زەیدمان هەبووایە دەم کوتی ئەم کەسانەمان بکردایە, کە جوێن بە تۆ ئەدەن. واللهی پێغەمبەری خواﷺ ئاوا لە ئێمە رازی نابێ واللهی پێغەمبەری خوداﷺ, یەك قومە ئاومان ناداتێ. جا برایان موسڵمانان پێتان بڵێم پیاو یەکجار دەمرێ لە ژیاندا, دەبا ئەو جارەش بە قوربانی محمد المصطفیﷺ بێ. با بە قوربانی پاراستنی شەریعەتی ئیسلام بێتن. وەکو سەحابەکانی پێغەمبەری خوا, روحمان هەرزان بێ بۆ فرۆشتن بۆ شەریعەتی خوا. ئەوکات خوا رەحممان پێدەکا. بەس خۆ زەلیلو زەبوون کردنتان و خۆ کرکردنتان لە گوناح مایەی غەزەبی خوایە. بەڵام بۆ خۆتان بۆ رۆژی قیامەتی خۆتان, بە جواب دێن بۆ گۆرینی بێ شەرعی؟.

أقول قولي هذا وأستغفر الله العظيم لي ولكم ولسائر المسلمين من كل ذنب, ادعوا الله وأنتم موقنون بالاستجابة.

بسم الله الرحمن الرحيم

اشهد أن لا اله الا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله اللهم صل وسلم وبارك على سيدنا وحبيبنا محمد ﷺ وعلى اله وصحبه, صل اللهم عن التابعين بإحسان الى يوم الدين ( ياايها الذين امنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم اعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يتق الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما) أما بعد أوصيكم عباد الله واياى اولا بتقوى الله الكريم وطاعته ولزوم اوامره وكثرة مخافته فان التقوى شعار المؤمنين ودثارالمتقين ووصية الله تبارك وتعالى فيَّ وفيكم أجمعين.

## تەوبە کردنی مالیکی کوڕی دینار.

ئەی برای موسڵمان, ئەی خوشکی موسڵمان, ئەی برای گەنجی بەڕێز، ئەی ئەو کەسانەی دەیانەوێ سولح لەگەڵ خوا بکەن, ئەی ئەو کەسانەی دەیانەوێ ببلە خۆشەویستی خوداو پێغەمبەری خوا ﷺ، تاکە دەرمان و چارەسەر کە بەکاردێ بۆ

حاڵی ئەم میللەتە تەنها سولح لەگەڵ خوایە, تاکە دەرمان کە بەکاربێ بۆ ئەوەی ئەم ژیانە ناخۆشەمان بۆ بگۆڕی بە ژیانێك کە تیایدا بەختەوەرو بە خۆشی و کامەرانی تێدا بژین ئەوەیە, کە بگەڕێینەوە لای خواو تۆبەیەکی تەواو بکەین, بەڵام ئێمە کاتێك ئەمانەوێ بگەڕێینەوە لای خواو سولح لەگەڵ خوا بکەین, ئەبینین شەیتانی ناپاك و لەعنەتی, وەسوەسەی ناخۆش‌و قسەی وا دێنێتە ناو دڵمان, کە لەو تەوبەو لەو سولحە ساردمان بکاتەوە, یەك لەو وەسوەسەی دێتە ناو دڵی موسڵمانەکان ئەوەیە, کە پێی دەڵێ باشە تۆ کێ ئەڵێ خوا لە تۆ خۆش دەبێت, تۆ ئەوەندە گوناهو بێ شەرعی‌و بێ ئەمری ئەو خوایەت کردووە, کێ دەڵێ خوای گەورە غەزەبی لە تۆ نەگرتووە, کێ دەڵێ خوای گەورە دەفتەری کردەوەکانت لە گوناهەکان سپی دەکاتەوە ئەم وەسوەسەیە شتێکی زۆر خراپە, وەسوەسەیەکی شەیتانییە کە بکەوێتە ناو دڵی هەر موسڵمانێك ساردی دەکاتەوە لەم سولحەی کە کردوویەتی جا بە تەوفیقی خودا انشاءالله دەچینە خزمەتی

قورئانی پیرۆزو چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی چارەسەری ئەم وەسوەسەمان بۆ بکات, دەرمانی ئەو وەسوەسەیەشمان بداتیو ئەوەشمان لە دڵ نەمێنێت,

تەماشا کەن کۆمەڵێك صحابەی رێكو پێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوناهیان زۆر کردبوو, بێ شەرعیان زۆر کردبوو, زوڵمیان لە نەفسی خۆیان کردبوو هاتنە لای پێغەمبەرﷺ و گوتیان یا رسول الله گوناهمان زۆر کردووە، دەبێ خوا لێمان خۆش بێ, ئایا لە بۆمان هەیە تەوبە بکەینو بگەڕێینەوە لای خوا؟ لەو کاتە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو صحابەکان زۆر عاجز بوون لە بێ دەنگی پێغەمبەر، لەبەر ئەوەی وایان هەست دەکرد تەوبەیان بۆ نییەو ئەو هەموو تاوانو گوناهانەیان کردیە, بەلآم لەو کاتەدا خوا لەسەر رووی حەوت تەبەقەی ئاسماندا, حەزرەتی جبرئیلی رەوانەی خوارێ کرد ئەو ئایەتە پیرۆزەشی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ کە بە موسڵمانەکان رابگەیەنێتو دەفـــەرموویت ﴿ وَإِذَا

جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِنَا فَقُلْ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ

كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ

مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ

فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾ ﴾الانعام/٥٤ پێغەمبەری خوا ﷺ

خەبەری دایە صحابەکانو فەرمووی خوای گەورە ئەو ئایەتەی بۆ

من رەوانە کردووەو ماناکەشی ئاوایە... یا محمد ئەگەر هاتوو

ئەو کەسانەی کە گوناهبار بوون, بەلام ئیمان و باوەڕیان تەواو

بوو ئیمانیان هەبوو بە تۆ بە پێغەمبەرایەتی تۆ بە قورئانەکەت،

پێیان بڵێ "سلام علیکم" سەلامێك لە ترسو لەرزی قیامەتتان

قوتار بکاتن, سەلامێك لە غەزەبی خوا نەجاتان بدات, سەلامی

خواتان لێ بێ "کتب ربکم علی نفسه الرحمة" خوای گەورە واجبی

کردووە لەسەر خۆی رەحم بە خەڵکی بکا، خوای گەورە وای

کردووە رەحمەتی پیش غەزەبی بکەوێتن لە بۆ کێ لە بۆ

"من عمل منكم سوء بجهالة" ئەو کەسەی گوناهێك‌و بێ شەرعیەك بکا یا سەرپێچیەکی فەرمانەکانی خوا بکا, بەڵام وا نەمێنێتەوەو موسرٍ بی لە گوناهەکان, "ثم تاب من بعده" پاش ئەوەی ئەو هەموو گوناهەشی کردیە تۆبە بکا سولح لەگەڵ خوا بکا, هەموو کارە پیس‌و خراپەکانی بگۆڕێ بۆ کردەوەی چاك‌و ڕێك, ئینجا خوای گەورە لێی خۆش دەبێ, لەبەر ئەوەی خوایەکی غفورو رەحیمە, خوایەکی وایە هەموو کات هەر بەندەکی پەشیمان ببتەوە, لە گوناهەکانی عەفوی دەکا و رەحمیشی پێ دەکا, تەماشا ئەوە عەزەمەتی خوایە، ئەوە گەورەیی‌و لێبووردنی خوایە، ئینسانێك بەم هەموو گوناهەی لەگەڵ خوای گەورەی کردیە، کاتێك روو بکاتە خوای گەورە، خوای گەورە سەلامی لێ دەکاو ئیستقبالی دەکا, تەماشاکە خوای گەورە لە قورئان دەفەرمووێ "قل يا عبادي الذين أسرفوا على أنفسهم لا تقنطوا من رحمة الله ان الله يغفر الذنوب جميعا انه هو الغفور الرحيم" خوای گەورە دەفەرمووێ ئەی بەندەکانی من تەماشای ئەم سیفەتە ڕێك

و پێکە بکەن، تەماشا بکەن کاتێك یەکێك دوژمنداری لەگەڵ یەکێك دەکا چۆن بە برادەرو بە دۆست بانگی دەکا.

خوای گەورە بانگی دەکا "یا عبادي" بانگی دەکا ئەی بەندەکانی من بانگی ناکا ئەی دوژمنانی من ئەی گوناهبارو موجریمەکان, بەڵکو بە لەفزێکی نەرمو خۆش کە دڵی موسڵمانەکان بهەژێنێ دەفەرمووی "یا عبادي الذين اسرفوا على أنفسهم" ئەی ئەو بەندانەی کەوا گوناهی زۆرتان کردیە " لا تقنطوا من رحمة الله" نائومێد مەبن لە رەحمەتی خوا، مەڵێن گوناهمان زۆرە, خوا لێمان خۆش نابێت "ان الله يغفر الذنوب جميعا" لەبەر ئەوەی خوا لە هەموو گوناهی بەندەیەك خۆش دەبێ کە پەشیمان ببتەوەو روو لە خوا بکاتن، ئینجا با بزانین هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە چ بوو، ئەو ئایەتەی ابن مسعود دەفەرمووێت بە ئومێدترین ئایەتە لە قورئان، با بزانین هۆی هاتنە خوارەوەی چییە ئیمامی طبرانی دەگێڕێتەوەو دەڵێ, ئەمە نازل بوو بەسەر وەحشی کوڕی حەرب, ئەو وەحشەی ئیمامی هەمزەی شەهید کرد, جا با بچینە ساحەی

مەعرەکە ئێستا با بچین‌و سەفەرێك بکەین بۆ ناو شەڕی ئوحد بزانین ئیمامی هەمزە چۆن شەهید کرا, دەبینین موسڵمانەکان لەگەڵ کافرەکاندا لە گەرمەی شەڕ دان، پاڵەوانێکی وەك هەمزە شێرەکەی وا لە دەستەو کافران راو دەنێ‌و کەس ناوێرێ مقاومەی بکا. وەحشی پێشتر پێیان گوتبوو, ئەگەر بێتوو هەمزەی بکوژی ئازادت دەکەین, لە خۆشی ئەوەی لە بەندایەتی قوتار بی‌و ببیتە ئینسانێکی ئازاد, هەستا ئەو تاوانە گەورەی کرد، بۆیە وەحشی دەڵێ من لە دوای هەمزەی بووم دار بە دار بەرد بە بەرد لە دوای بووم، بۆ ئەوەی هەلێك ببینمەوە. رمێکی لە سینگی بدەم, منیش ئەوەندە نیشانەم راست بوو, زۆر کەم هەبوو رمی من غەڵەت بکاو لە هەدەف گیر نەکەم, دەڵێ لەو کاتەی لێی نزیك بوومەوە، کابرایەك کەوتە پێش ئیمامی هەمزە لێی ئاوڕداوەو گوتی وەرە مەیدانێ, شێرێکی وای لە کابرا دا سەری لە لەشی جودا کردەوە, گووتی لەو کاتە زانیم ماندوو بووەو خەریکی ئەوەیە تەماشای کوژراوەکە دەکا، گوتی رمێکم

لێداو لە پشتی هاتە دەرێ, گوتی تەماشایەکی منی کردو ویستی لێم نزیك ببێتەوەو نەیتوانیو کەوتە زەوی، گوتی لەسەری راوەستام هەتا روحی دەرچوو, جا پاشان ئافرەتێك کە ناوی هیند بوو خێزانی ئەبو سوفیانی بوو, گوتی وەرە سینگی بدڕەو دڵەکەی بدە دەستم, بەڵێ ئەو ئافرەتە دڵەکەی ئیمامی هەمزەی لە ناو دەستی خۆی ناو گوشیو خوێنەکەی لە ناو دەستی هاتە خوارێ، پاشان لووت و گوێی لێ کردەوە، پاش ئەوەی پێغەمبەر هاتە سەر ئەم لاشەیە دیتی بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین لووت و گوێیان لێ کردۆتەوە. سینگیان شەق کردیەو دڵیان دەرهێناوە, زۆر تووڕە بوو، گریاو فەرمووی قەسەم بەو خودایە, دەبێ حەفتا لە کافرەکان وا لێ بکەمەوە. لەو کاتەدا وەحش زانی ئیشەکە زۆر مەترسیدارە، زانی پێغەمبەری خوا لێی خۆش نابی نەوێرا بێتە لای پێغەمبەریﷺ هەر لە مەککە ماوەو خۆی حەشار دەدا، پێغەمبەریشﷺ بەدایدا دەگەڕا تۆڵەی لێ بسێنێتەوە, لەو کاتەی پێغەمبەری خواﷺ فەتحی مەکەی کرد وەحش هەڵات, چووە

طائیف ماوەیەك لەوێ ماوە، کە خەڵکی ئەوێ بوونە موسڵمان‌و هاتنە لای پێغەمبەرﷺ وەحش دەڵێ فکرم دەکردەوە بۆ کوێ هەڵێم بۆ عێراق, بۆ ڕۆمەکان, بۆ شوێنێك هەڵێم لە دەستی ﷺ نەجاتم ببێ، گوتی لەبەر ئەوەی ئیسلامەتیشم خۆش دەویست لەبەر ئەوەی حەزم دەکرد خوا لێم خۆش بێ, بۆیە نامەکم بۆ پێغەمبەر ﷺ نووسی، گوتم یا محمد من پەشیمانم لەو تاوانەی کردیتم, بەلاّم ئایەتێك هەیە لێ ناگەڕێ من بگەڕێمەوە, ئەویش ئەوەیە خوای گەورە دەفەرمووێ, هەر کەسێك شرکی بۆ خوا پەیدا نەکاو زینا نەکاو قەتل نەکا, خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێتن، لەو کاتەدا خوای گەورە تەماشاکە چەند بە رەحمە ئینسانێکی وەکو وەحشی کوڕی حەرب, کێی کوشتووە ئیمامی هەمزەی کوشتووە، چ همزەیەك کاتێك پێغەمبەر لەسەر لاشەکەی راوەستابوو حەزرەتی جبرائیل هاتە خوارێ‌و فەرمووی یا محمد خوای گەورەناوی لە هەمزە ناوە "أسد الله ورسوله" شێری خواو پێغەمبەرییە، ئەو وەحشییە ئەو تاوانە گەورەیەی

کردووە شێری خوای کوشتووە, چۆن دەبێ ئەو تاوانە لێی ببوردرێ لەو کاتەدا پێغەمبەرﷺ نامەکەی خوێندەوە خوای گەورە ئایەتی نارد فەرمووی "الا من تاب وامن وعمل عملا صالحا فأولئك يبدل الله سيئاتهم حسنات وكان الله غفورا رحيما" فەرمووی ئیلا ئەوەی تەوبە بکاو کاری چاك بکاو کردەوەی باش بکا خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی خۆش دەبی‌و هەموو گوناهەکانیشی بە چاکە دەنووسێ، لە نامەیەکی بۆ وەحشی نووسی‌و رەوانی کرد، وەحش کە نامەکەی خوێندەوە بۆ پێغەمبەری نووسی یا رسول الله لەو نامەیەت ئەو ئایەتەی تێدا نووسراوە کە دەڵێ "وعمل عملا صالحا" من یەك عەمەلی صالحم نییە، پێناچێ خوای گەورە لێم خۆش بێ، نامەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ رەوان کردەوە، دووبارە خوای گەورە ئایەتێکی تری رەوانە کردەوە فەرمووی "ان الله لا يغفر ان يشرك به ويغفر مادون ذلك لمن يشاء" بزانە خوا چەند بە غەمی بەندەیە بگەڕیتەوە، فەرمووی خوا لە هەموو عەبدێك خۆش دەبی بەس شرکی پەیا نەکاو هاوتا

لە بۆ خوا پەیدا نەکا نامەکەی بۆ وەحش نووسیو ئەم ئایەتەی تیا بوو رەوانەی کرد، وەحش نامەکەی خوێندەوە هێشتا دڵی ئاوی نەخواردەوە، فەرمووی یا رسول اللہ ئاوا خوای گەورە فەرمووی "لمن یشاء" کێ دەڵێ خوا حەز دەکا لە من خۆش بێ، کێ دەڵێ خوا لە من دەبووری و حەز دەکا ببمە موسڵمان، لەو کاتەدا خوای گەورە ئەو ئایەتەی نارد کە دەفەرمووێ ﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ ... ﴿٥٣﴾ ﴾(الزمر)

ئینجا کە ئەو ئایەتەی خوێندەوە زۆر کەیف خۆش بوو، کە خوای گەورە لە هەموو گوناهێك خۆش دەبی، ئەگەر چی شێری خواو پێغەمبەری ﷺ کوشتبێ. لەگەڵ وەفدەکەی طائیف هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر فەرمووی تۆ وەحشی کوڕی حەربی؟ فەرمووی بەڵێ فەرمووی چۆن ئیمامی هەمزەت

کوشت؟! حیکایەتەکەی بۆ گێڕاوە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر هەستی بە ناخۆشی کرد، ئینجا فەرمووی باشە هەستە بڕۆ لە پێش چاوم بزر بەو نەتبینم، چونکە هەر چەند جاری تۆ دەبینم شکلی ئیمامی هەمزەم بە بیر دێتەوە، بەڵێ وەحش ڕۆیشت و خوای گەورە لێ خۆش بوونی بۆ ڕەوان کرد. جا وەحشیەك شێری خوای کوشتبێ خوا لێی خۆش بێ، توخوا ئینسانێکی وەکو ئێمە ئەگەر تەوبە بکەین چۆن خوای گەورە لێمان خۆش نابێ. وەحش ئەمەی لە دڵ بوو، دەبێ تۆڵەی ئیمامی هەمزە بکاتەوە، دەبێ شتێکی وا بکا سبەینێ بە ڕوو سپیەتی بە خزمەت خوای گەورە بگاتەوە، ئەوە بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا هەموو غەزایەکانی کرد، پاشان کاتێك موسەیلەمەی کەذاب پەیدا بوو، بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکرد هەستا چۆوە مەیدانێ و شەڕی کرد، هەر بەم ڕومحەی ئیمامی هەمزەی کوشتبوو، موسەیلەمەی کەذابی کوشت، ئەوجا فەرمووی الحمدلله کە جاهیل بووم گەورەترین پیاوم کوشت، بەڵام کە موسڵمان بووم پیسترین

پیاوم کوشت، بەڵێ بەم رومحەی ئیمامی هەمزەی پێشەهید کرد، هەر بەم رومحەی تۆڵەی ئیمامی هەمزەی لە موسەیلەمەی کذابی کردەوەو کوشتی. جا ئەوەیە رەحمی خوا، ئەوەیە بەزەیی خوا کە کەسێك ئەو تاوانە گەورەیەی کردبێ، ئاوا ئایەتی بۆ بنێرێو لێی خۆش ببی بۆیە شاعیرێك دەڵێ

یا ربی أن عظمت ذنوبي كثرة
فلقد علمت بان عفوك أعظم
ان كان لا يرجوك الامحسن
فمن ذا الذي يدعو ويرحم المجرم
مالي وسيلة اليك الا الرجا
وجميل عفوك ثم اني مسلم

خوای گەورە لە حەدیسێکی قودسیدا کە پیغەمبەر ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە، دەفەرموویتن "یا عبادي" ئەی بەندەکانی من "أنكم تخطئون باليل والنهار" ئێوە بە شەوو بە رۆژ بێ فەرمانی من دەکەن "أنا أغفر الذنوب جميعا وأستغفروني استغفر لكم"

دەفەرمووێ ئێوە شەوو ڕۆژ گوناه دەکەن شەوو ڕۆژ فەرمانەکانی من دەشکێنن، منیش لە هەموو گوناهێکتان خۆش دەبم، ئێوە تەوبە بکەن و من تەوبەتان لێ قبولْ دەکەم. وە لە فەرموودەیەکی قوسی تردا کە پێغەمبەر بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ "يا ابن ادم" ئەی نەوەی ئادەم "انك مادعوتني ورجوتني غفرت لك ما كان ولا ابالي" دەفەرمووی ئەی بەندەی من، ئەی بەنی ئادەم، تەنها تۆ بپاڕێوەو دەست بەرز بکەوە هاواری من بکە، چونکە من تەنها لە بەندەکەی خۆم خۆش دەبم، تۆبە بکەو هاواری من بکە من لە گوناهەکانت خۆش دەبم هیچیشت لەگەلْ ناکەمو بە فکریشت ناهێنمەوە "يا بني ادم لو بلغت ذنوبك عنان السماء ثم استغفرتني غفرت لك" دەفەرمووی ئەی بەنی ئادەم ئەگەر گوناهەکانت ئەوەندە بەرز ببێتەوە تاکو سورەیەی ئاسمان بڕوا، تاکو ئەستێرەکانی ئاسمان بڕوا، بەس تەوبە بکەی خوا لە گوناهەکانت خۆش دەبێ، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێ "يا ابن ادم انك لو أتيتني بقراب الارض خطايا ثم لقيتني لا تشرك بي شيئا

لاتیتك بقرابها مغفرة" دەفەرمووێتن ئەی بەنی ئادەم ئەگەر تۆ گۆی زەوی دابپۆشی لە گوناه ئەوەندە گوناهە بکەی، بەڵام کاتێ تەوبە دەکەیت دەگەڕێتەوەو سولح لەگەڵ من دەکەی بەس شرك بۆ من پەیدا مەکە، من بە قەدەر زەوی لێخۆشبوونت بۆ دەهێنم و لێت خۆش دەبم، ئەوەیە رەحمی خوا ئەوەیە لوتف و مەرحەمەت و رەحمی خوا کاتێك ئاوا روو لە بەندەکانی خۆی دەکاو داوای بەهەشتو مەغفیرەتی لێدەکاتن، بۆیە لە ئەثەرێکدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویتن ئەگەر هاتوو بەندەیەك پاڕاوە لە خواو تەوبەی کرد، خوای گەورە دەفەرموویتە حەزرەتی جوبرائیل پەلە مەکەو دوعایەکەی لێ موستەجاب مەکەو جوابی مەدەوە، لەبەر ئەوەی من حەز دەکەم گوێم لە دەنگی ئەم بەندەیەم بی، حەز دەکەم گوێم لە بەندەیەك بیو هاوار بکاو بڵێ خوایە لە گوناهەکانم خۆش ببی، تاکو رەحمی پێبکەمو لە گوناهەکانی خۆش ببم. رۆژێکیان پیرەمێردێك ئەوەندە پیر بوو دەستی لەسەر گۆچانەکەی دەلەرزی، پشت چاوەکانیشی

کەوتبوونە سەر رووومەتی هاتە لای پێغەمبەرﷺ فەرمووی یا محمدﷺ چ دەڵێی بۆ کابرایەکی ئەوەندە گوناهی کردبی، ئەوەندە بێ فەرمانی کردبیو ئەوەندە فەرمانی خوای شکاندبی، ئەگەر بێتو گوناهەکانی تەوزیع بکرێ، بەسەر کورەی زەوی هەمووی بە هیلاکەت ببا؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی تۆ ئیمانت هەیە؟ فەرمووی بەڵێ من دەڵێم (أشهد أن لا اله الا الله وأشهد أنك رسول الله)، فەرمووی تەوبە بکە خوا لە هەموو گوناهەکانت خۆش دەبیو هەموو خراپەکانیشت بۆ بە چاکە دەنووسرێ. سەحابەکان دەڵێن واللهی دیتم ئەو پیرەمێردە گوتیە پێغەمبەرﷺ هەموو گوناهەکان، فەرمووی بەڵێ لە هەموو گوناهەکان گوتی لە خۆشیان گۆپاڵەکەی بەرز کردەوە فەرمووی (الله اکبر.. الله اکبر) جا بە راستی ئەمە بەشارەتە ئەمە موژدەی پێغەمبەرییە بۆ ئێمە. هەرچەندە گوناه بکەین بەڵام بە دڵێکی ساف و بێگەرد بەڕاستیو دروستی بگەڕێینەوە لای خوا شرك و هاوتای بۆ پەیدا نەکەین، خوای گەورە لە گوناهەکانمان خۆش دەبێ. تەماشاکەن

پیاوچاکانی پێش ئێمە سەلەفی سالحی ئێمە چۆن تەوبەیان کردیە. یەك لەوانەی دەیانگێڕینەوە بۆ ئەوەی ببێتە دەرس و پەند بۆ ئێمە مالیکی کوری دینارە، مالیکی کوڕی دینار لە مزگەوتی کوفە وتاری دەدا، ئەو رۆژەی وتاری بدابایە خەڵکی کوفە هەموو کۆ دەبوونەوە بازاڕو دوکانەکانیان دادەخست، دەهاتن گوێیان لێ دەگرت، رۆژێکیان مالیکی کوڕی دینار وتاری دەدا هەموو خەڵك کۆبوونەوە، چاوەڕوانی قسەکانی مالیکی کوڕی دینارن حەزی کرد باسی تەوبەی خۆی بکا، باسی گەڕانەوەی خۆی بۆ ئەم خەڵکە بکا، ئەوانیش وەکو مالیکی کوڕی دیناربگەڕێنەوەو تەوبە بکەن فەرمووی خەڵکینە خوا لە گوناهی مالیکی خۆش بی، من شورتە بووم، زۆر غەدرچی و موجریم بووم، خەڵکم زۆر ئەزیەت دەدا ئەبەدەن لەسەر هیچ گوناهێك پازم نەئەدا، گوناهم بە کەیفی خۆم و هەوەسی خۆم دەکرد. گوتی پاشان جاریەیەکم کڕی. جاریەیێکی زۆر ڕێك و پێك بوو، کردمە ژنی خۆم و لە خۆم مارە کرد، هـــەرچەندە بڵێی ئەو ژنەم خۆش دەویست تاقە هیواو

چرای ژیانم ئەم ژنە بوو، بەڵام هەندەی پێ نەچوو تەمەنی کورت بوو مرد، دونیا لە پێش چاوم تاریك بوو گلۆپی هیوام کوژاوە بەڵام یەك کچی لە پاشە خۆی بەجێ هێشتبوو، ئەوە بڕێك ئارامیو سەبووریم ئەهاتەوە بەو کچەم، هەرچەندە موسریش بووم لەسەر گوناهەکانی خۆشم، هەندەی پێ نەچوو حەزرەتی عزرائیل هات روحی کچەکەمی کێشاو بردی، زۆر عاجز بووم، لە جیاتی ئەوەی بگەڕێمەوە لای خوا بەرامبەر ئەم موسیبەتە دەستم لە گوناه کوشیو زیاتر بێ ئەمری خوام دە کرد، ئەوەبوو دەستم کرد بە ئارەق خواردنەوە کرد کە شەو نەبوو بەئاشکار چەند بتڵە ئارەقێك نەخۆمەوە، حاڵم ئاوا بوو هەتا رۆژێکیان لە ناو بازاڕی لە ژنێکم دا، ژنەکە هەرچەند پاڕاوە گوتی لەبەر چی لێم دەدەی، منداڵی هەتیمم زۆرەو فەقیرین بۆیە هاتینە ئێرە، هەرچەندی پاراوە، رەحمم پێ نەکرد، هاتمەوە ماڵێ نیوەی مانگی شەعبان بوو خەوم لێکەوت، لە خەومدا وامزانی قیامەتە خەڵکێکی زۆر کۆبوونەتەوە لە حاڵێکی زۆر ناخۆش دان، هەر

کەس غەمی خۆیتیو حیسابی لەگەڵ خۆی دەکا، دەبێ چی بەسەر بێ، لەو کاتە دەنگێکی زۆر گەورە هات کاتێ ئاوڕم دایە وە، دەبینم دەعبایەکی زۆر گەورەیە دەمی بەش کردیتەوە، بۆ من دێتن هەلاتم لەبەری، ڕۆیشتم گەیشتمە پیرەمێردێك دارێکی لە دەست بوو، گوتم خاڵە گیان هەوڵ بدە ئەو دەعبایەم لە کۆڵ بکەوە، دەیەوێتن بمخواتن، چاوی ئاگری لێ هەڵەستێو ئەیەوێ بمفەوتێنی، گوتی ڕۆڵە گیان دەستی بە گریان کرد، گوتی تاقەتم نییەو بۆ خۆت هەڵێ من ناتوانم ئەم دەعبایە لە کۆڵ تۆ بکەمەوە. ئینجا ڕامکرد تا گەیشتمە ڕۆخی جەهەنەمێ لە تاو ئەو دەعبایەی لە دوامە، ویستم خۆم بهاوێمە ناو جەهەنەمێ بانگیان کرد گوتیان یا مالیك بگەڕێوە، ئەوە شوێنی تۆ نییەو بۆ تۆ دروست نەکراوە، یەکسەر گەڕامەوە گەیشتمەوە پیرەمێردەکە، گوتم خاڵە ڕەحمی خوات لە دڵدابێو نەجاتم بدە لەو دەعبایە، وەختە بمخوا گوتی ڕۆڵە گیان بە خوا ناتوانم، بڕۆ ئەم شاخەی خەڵکی وا ئەمانەتی خۆی لەوێ داناوە، تۆ ئەگەر ئەمانەتێکت لەوێیە بەڵکو لە سەرت

بە جواب بێ گوتی چووم بەسەر شاخی کەوتم، بینیم ئەمانە شاخ نییە، ئەمە هەمووی زێڕو گەوهەرو زیوە هەموو رازاوەتەوە پەردەی وەکو حەریری پێوە دراوە، گوتی لەو کاتەی نزیك بوومەوە بینیم یەك کۆمەڵە منداڵ بەرەو پیلم دێن لەو کاتەدا دەعبایەکە هەندەی نەماوە بم گەزی و قوتم بدا لەو کاتەدا منداڵەکان دایانە بەر بەردانو لە کۆڵە منیان کردەوە، دیتم کچەکەی من وا لەگەڵیتیان بانگ دەکات أبتي.. أبتي.. بابە گیان.. بابە گیان وەرە ئێرە، گوتی دڵم زۆر خۆش بوو بەرەو کچەکەم رۆیشتم، دەستی چەپی بۆ درێژ کردم، منیش دەستی راستم دایێو بە دەستەکەی تریش بەردی لە دەعباکەی دەگرت، لە کۆڵم بکاتەوە لەو کاتەدا رایکێشام و لەسەر رانی خۆمو لەسەر کۆشی خۆم داناو ئەویش دەستی لە ردێنی ئەدام فەرمووی بابە گیان "ألم يأن للذين آمنوا ان تخشع قلوبهم لذكر الله" گوتی بابە گیان وەختی ئەوەی دانەهاتووە، ئەو کەسانەی ئیمانیان هەیە، دڵی بترسێ لە ترسی خواو تەوبەی بکا، گوتی سەرم سوڕماو دەستم بە گریان

کرد رۆڵە گیان تۆ قورئان خوێنی؟ گوتی بەڵێ بابە گیان ئێمە لە تۆ باشتر دەزانین قورئان بخوێنین، گوتم باشە ئەم دەعبایە چی بوو گوتی ئەم دەعبایە کردەوە خراپەکانت بوو، گوناهو بێ ئەمریەکانت بوو، ئاوها بە قوەتت کردبوون بت فەوتێنن گوتم ئەی ئەو پیرەمێردە کێ بوو گوتی کردەوە چاکەکانت بوو، هیچ چاکەیەکی وات نەبووە بە هانات بێو قوتارت بکا، پاشان گوتم ئەی ئێوە لێرە چی دەکەن؟ گوتی ئێمە منداڵە موسڵمانەکانین خوای گەورە لێرەدا کۆی کردینەوە، مەلائیکەتی خوا خزمەتمان دەکەن، ئینتیزارو ئێوە دەکەین لە قیامەت شەفاعەتتان بۆ بکەینو نەجاتتان بدەین لە عەزابی خوا، گوتی لەو کاتە بە خەبەر هاتم، زۆر دەترسام دەلەرزیمو هەڵسام بتڵە ئارەقەکانم هەموو شکاندو رێشتمو تەوبەیەکی نەسوحم کردو گەڕامەوە لای خوای گەورە، گوتی لەو کاتەی تەوبەم کرد، نەدەچوومە ناو خەڵکی، بەڵام ئەم دەعبایە لە کۆڵم نەدەگەڕا، بەردەوام نوێژو تاعەتم دەکرد، ئەو دەعبایە هەر لە خەیاڵم بوو وا بەرەو جەهەننەم

ئەمبا، عیبادەتی خوام دەکرد، لە جەوێکی زۆر ترسناك ئەو ساڵەی ئەمن تەوبەم تیا کرد باران نەئەباری، گوتی هەرچەندە نوێژە بارانەمان دەکرد نەدەباری گوتی شەوێ نیوەی شەو خەڵك هەمووی ڕۆیشتن من مامەوە بۆ ئەوەی بسەلمێنم بۆ خوا کە بە ڕاستی تەوبەم کردیە، گوتی لەو کاتەدا کابرایەکی لاوازی لاق باریکی، سینگ گەورە هات رووی لە ئاسمان کرد فەرمووی یا سیدي ئەی گەورەی من، تۆ ئەو هەموو خەڵکە دەگەڕێنیەوە خۆ لە تۆ کەم نابێتەوە ئەگەر باران ببارێنی، سوێندم بەو خۆشەویستیەی کە تۆ بۆ منت هەیە، دەبێ ئێستا بارانی ببارێنی، گوتی هێشتا لە قسەکانی نەببۆوە باران بە تەوژم هاتە خوارێ بۆ زەوی، گوتی منیش زۆرم پێ سەیر بوو، دەبێ ئەم کابرایە کێ بێ، گوتم خاڵە گیان تۆ شەرم ناکەی دەڵێی سوێند بەو خۆشەویستیەی تۆ بۆ منت هەیە، کێ دەڵێ خوا ئەتۆی خۆش دەوێ، گوتی ئای ئەو کەسەی غافڵە لە خوا و بە ئوموری خۆی خەریکە، ئەگەر خوا منی خۆش نەوێت چۆن منی کردیتە

موسڵمان، ئەگەر خوا منی خۆش نەوێت چۆن ئەو عەقلەی پێداوم، ئەگەر خوا منی خۆش نەوێت چۆن ئەو هەموو نوورو ئیمانەی پێداوم، ئەوانە هەموو خۆشەویستی خوانە بۆ من بۆیە من موتەئەکیدم خوا منی خۆش دەوێ، ئەی نەتبیستیە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویتن "ان الله وملائکته یصلون علی الذین امنوا" نەتبیستووە خوای گەورەو مەلائیکەتەکانی خواش صەڵاواتی لەسەر ئەو کەسانە لێئەدەن کە ئیمانیان هەیەو موسڵمانن، صەڵاواتی(خوا ئەوەیە زیکری ئەو ئینسانانە بکاو باسیان بکاو لە لای مەلائیکەتەکان مەدحیان بکاو مەلائیکەتەکانیش دوعای خێر بۆ ئەو ئینسانە بکەن، مالیکی کوڕی دینار گوتی ئینجا دڵم ئاوی خواردەوە، ئینجا زانیم خوای گەورە منی خۆش دەوێ بۆیە ئەو تەوبەیەی بە قسمەت من کردیە هەتا ئەو خۆشەویستیەی لە دڵی من نەباتە دەرێ. دەڵێ پاشان تەوبەیەکی ئاوهام کرد، خوای پەروەردگار دەرگای علمو مەعریفەت و موحیبەتی خۆی لێ کردمەوە. جا برایانی بەڕێز ئەو

خۆشەویستیەی خوا لە دڵی ئیمەی داناوە نەیفەوتێنین با ئەو خۆشەویستیەی بە نووری تەوبە رووناك بکەینەوەو خوا لێمان خۆش بێ‌و حاڵیشمان چاك بکا.. یا رەبی خوایە لە گوناهەکانمان خۆش بی یا رەبی خوایە عەفومان بکەی، خوایە ئەو دڵانە بە نووری خۆت روناك بکەیتەوە. یا رەبی خوایە دەفتەری کردەوەکانمان لە گوناهان سپی بکەیتەوە، ئەو وەزعەشمان بۆ چاك بکەیت آمین..

آمين و الحمدلله رب العالمين

- **موسلمانانی بەڕێز:**

کۆمەڵە خەڵکانێك هاتنە لای ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم، گوتیان یا ئیمام ئێمە هەرچەندە تەوبە دەکەین‌و دەگەڕێینەوە دڵمان سارد دەبێتەوەو واز لە تەوبەکە دەهێنین‌و دەگەڕێینەوە سەر گوناهەکان، گوتی گویٚ لەم پێنج ئامۆژگاریە رابگرن، ئەگەر ئەم ئامۆژگاریانەتان لە من وەرگرت جارێکی تر ناگەڕێنەوە سەر گوناهەکانتان، جا ئێمەش با بێین بە وردی گویٚ بۆ ئەم پێنج

ئامۆژگاریانەی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم بگرین. بۆ ئەوەی نەتوانین جارێکی تر گوناه بکەین‌و بگەڕێینەوە سەر گوناهەکانمان:

**یەکەم:** گوتی ئەگەر تۆ دەتەوێ گوناه بکەی رزقی خوا مەخۆ. گوتی چۆن دەتوانم، هەموو گیانم و حەیاتم‌و تەندرووستیم رزقی خوایە، چۆن رزقی نەخۆم.. گوتی ئەی چۆن رزقیشی دەخۆی‌و بێ ئەمریشی دەکەم.

**دووەم:** گوتی ئەگەر دەتەوێ گوناهبکەی بڕۆ بۆ مەملەکەتێك گوناه بکە هی خوای گەورە نەبێ. گوتی باشە من هەر شوێنێك بچم هەر هەمووی ئی خودایە چۆن شوێنێك هەیە ئی خودا نەبێ‌و مەملەکەتی ئەو نەبێ، گوتی: باشە تۆ رزقی کەسێك دەخۆی لەسەر مەملەکەتی ئەو دەژی چۆن گوناه دەکەی...

**سێیەم:** گوتی کاتێك گوناه دەکەی بڕۆ شوێنێك خوای گەورە نەتبینی، گوتی چۆن خوا نامبینی، بچمە هەر شوێنێك خوای گەورە دەمبینێ و پێم ئاگادارە گوتی چۆن رزقی کەسێك دەخۆی

لەسەر مەملەکەتی ئەو دەژیتو هیچ کاتێك لە تۆ بێ ئاگا نابیٚو گوناھ دەکەی......

**چوارەم:** گوتی کاتێك مردن هات بە ملك الموت بلێ ماوەم بدە تا هەندێك خێرو چاکە دەکەم، گوتی وە اللهی یەك خولەکیش لە سەرم راناوەستی.. گوتی باشە مادام دەزانی ڕاناوەستی لەسەرت یەك خولەك، لە خۆت تەئمینی لە دوای قسەکانی من مەلەکلمەوت نایێو روحت ناکێشی، چۆن گوناھو بێ شەرعی دەکەی....

**پێنجەم:** گوتی لەو کاتەی زەبانیەی جەھەننەم، ئەو مەلائیکەتانەی دێن سزات بدەن، ئەتویان گرتو بەرەو جەھەننەمت ببەن، خۆت بپچڕەوەو بلێ نایەم لەگەڵتان، بەرەو بەھەشت دەچم. گوتی لێم قبولٚ ناکەن بە کەیفی من نییەو بە کەیفی ئەوانە. گوتی باشە مادام دەزانی لێت قبولٚ ناکەنو دەتبەن بەرەو جەھەننەمو لێناگەڕێن بچیە بەھەشتێ، چۆن بێ ئەمری و بێ فەرمانی خوای دەکەیت.

جا بەڕاستی وایە ئێمە رزقی خوای گەورە دەخۆین، لەسەر زەوی خوای گەورە دەژین، لە ناو مەملەکەتی خوای گەورە دەژین، هەموو کاتێ خوای گەورە ئێمەی لێ دیارەو ئاگادارە بە هەموو شتێکی ئێمە، مەلەکولمەوتیش بێ یەك خولەك تەئخیرمان ناکا، ئەی چۆن بێ ئەمری خوا ئەکەین، چۆن لە خوای گەورە ناترسێین. چۆن شەرمەزاری نامانگرێو بێ فەرمانی خوای گەورە بکەین. جا بۆیە دەڵێم وەرن با تەوبەیەکی نەسوح بکەین، دەست لە ناو دەستی پێغەمبەر بنێین و بەیعەتی بدەینێو بڵێین یا رسول الله تەوبە بێ لەسەر دەستی تۆ، ئێمە دەگەڕێینەوەو تەوبە دەکەینو تەوبەکی نەسوح بۆ لای خوای گەورە، با ئاگامان لە خۆمان بێتن چونکە ژیانی دنیا فورسەتە با لە دەست خۆمانی نەدەین.

بە پشتیوانی خـــوا،
ئەم بەرهەمانەی خوارەوەش،
لە ئامادەکردندایە،

1- ﴿تەقوا﴾

2- ﴿گەشتێ بەناخی مرۆڤدا﴾

3- ﴿با پەند وەرگرین﴾

